# بنەماکانی تەزکیەی نەفس

نوسینی : عبدالرزاق البدر
وەرگێڕانی : أبو يحيى الكردی

6/ شەوال/1445

بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَٰنِ الرَّحِيم

## ناسنامەی کتێب

ناوی کتێب: بنەماکانی تەزکیەی نەفس

نوسینی: عبدالرزاق بن عبدالمحسن البدر

ئامادەکردنی: أبو يحى الكردي

ژمارەی پەڕە: ٨٤

ساڵی: ٦/شوال/١٤٤٥هـ

# بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَٰنِ الرَّحِيمِ

## پێشەکی:

{إنَّ الْحَمْدَ لِلهِ نَحْمَدُهُ وَنَسْتَعِينُهُ وَنَسْتَغْفِرُهُ ، وَنَعُوذُ بِاللهِ مِنْ شُرُورِ أَنْفُسِنَا وَمِنْ سَيِّئَاتِ أَعْمَالِنَا ، مَنْ يَهْدِهِ اللهُ فَلاَ مُضِلَّ لَهُ ، وَمَنْ يُضْلِلْ فَلاَ هَادِىَ لَهُ ، وَأَشْهَدُ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللهُ وَحْدَهُ لاَ شَرِيكَ لَهُ ، وَأَشْهَدُ أَنَّ مُحَمَّدًا عَبْدُهُ وَرَسُولُهُ صَلَّى اللهُ عَلَيهِ وَسَلَّم وَعَلَى آلِهِ وَصَحبِهِ وَمَن تَبِعَهُم بِإحسَانٍ إلَى يَومِ الدِّين وَسَلِّم تَسليِماً كَثِيراً. }

ئەو نەفسەی کە لەنێوان دوو شانەکە و سینگی ئینسانە، نوسین و قسەکردن لەسەری زۆر گەورەیە زۆر گرنگە،الله سبحان و تعالی سوێندی خواردووە بە کۆمەڵێک لە دروستکراوە گەورەکانی کە ئاماژەن بۆ گەورەیی خۆی لە سورەتی الشمس سەبارەت بە نەفسی سەرکەوتوو و بە نەفسی ناسەرکەوتوو: {

وَٱلشَّمۡسِ وَضُحَىٰهَا (١) وَٱلۡقَمَرِ إِذَا تَلَىٰهَا (٢) وَٱلنَّهَارِ إِذَا جَلَّىٰهَا (٣)
وَٱلَّيۡلِ إِذَا يَغۡشَىٰهَا (٤) وَٱلسَّمَآءِ وَمَا بَنَىٰهَا (٥) وَٱلۡأَرۡضِ وَمَا طَحَىٰهَا
(٦) وَنَفۡس وَمَا سَوَّىٰهَا (٧) فَأَلۡهَمَهَا فُجُورَهَا وَتَقۡوَىٰهَا (٨) قَدۡ أَفۡلَحَ
مَن زَكَّىٰهَا (٩) وَقَدۡ خَابَ مَن دَسَّىٰهَا (١٠)}.

فەرمووده‌ی الله { **قَدۡ أَفۡلَحَ مَن زَكَّىٰهَا** }: أصلى زه‌كات: زیاده‌یه‌كه له خێر، وه مه‌به‌ست له ئایه‌ته‌كه ئه‌وه‌یه كه ئه‌وانه‌ی كار له سه‌ر نه‌فسی خۆیان ده‌كه‌ن، وه نه‌فسی خۆیان چاك ده‌كه‌ن، به‌رزی ده‌كه‌نه‌وه و به‌رز ڕایده‌گرن به گوێڕایه‌ڵی و خێر بۆ الله جل جلاله، دور ئه‌كه‌وێته‌وه له‌و تاوانانه‌ی كه به‌ختەوەری و ڕزگاربونی ئه‌و به‌ستراوه‌ته‌وه به دور كه‌وتنه‌وه له‌و تاوانانه.

فەرمووده‌ی الله{ **وَقَدۡ خَابَ مَن دَسَّىٰهَا** }: أصلى التدسية: ئه‌وه‌یه ئه‌و نه‌فسه‌ی كه الله جل جلاله پێی خۆشه ده‌ر بكه‌وێ به پاكی ئه‌و به تاوان ده‌یشارێته‌وه، كه‌سی گوناحبار نه‌فسی خۆی كپ كردۆته‌وه به تاوان، له‌ناوی بردووه به‌هۆی گوناحه‌وه، هه‌تا وای لێ هات بووه نه‌فسێكی بۆگه‌ن و نزمو كه‌م نرخ

إبن قیم دەفەرموێت: نەفسی پاک و شەریف رازی نابێ لە دنیا ئیلا بە بەرزترین و باشترین کردەوەکان نەبێت، نەفسی پاک شتێک ناکات کە لە دنیا و عاقیبەت جێگەی سوپاس نەبێ، (نفس الدنیئة)ئەو نەفسە نەخۆشە دائیمەن دەگەرێ بەدوای شتی کەم و ئەوەی زیاتر زەرەر بە نەفسی دەگەیەنێ هەر وەک چۆن مێش دەگەرێ بەدوای شتی پیس تا پێوەی بنیشێتەوە نەفسی پیسیش بەوجۆرەیە ئەگەرێ بەدوای تاوان و لەزەتەکانی دونیادا، ئەمما نەفسی پاک و جوان ڕازی نیە لە دونیا زوڵم بکات، وە بەدرەوشتی بکات، وە دزی بکات، وە خیانەت بکات; نەفسی ئینسان زۆر لەوە گەورەترە بە تاوان لەناوی بەرێت، بەڵام ئەو نەفسەی کە ماندوو و نەخۆش و پیسە ئەوا دەگەرێ بە دوای ئەوتاوانانە، وە هەموو نەفسێ بەدوای هاوشێوەی خۆی دەگەرێ، ئەونەفسانەی شەریفن دەگەرێن بەدوای کار و کردەوەی باش و بەرز و جواندا وە ئەو نەفسانەی کە پیس و بۆگەنن دەگەرێن بەدوای کار کردەوەی خراپ و ناشریندا)[١]

(١):الفوائد لابن قیم ص١٧٨

کاتێک کە پاککردنەوەی نەفس لەو پلە بەرزەیە ئەوە پێویستە لەسەر کەسی راستگۆ کار لەسەر ئەوە بکات کە نەفسی خۆی پاکەوە کات، پێویستە ئەو کەسەی کە بەزەی بە نەفسی خۆی دێتەوە زۆر کار لەسەر نەفسی خۆی بکات و جیهادی نەفسی خۆی بکات ئەوپەری جوهدی بەکار بیەنێ بۆ گەیشتن بەو پلە گەورەیە بۆ ئەوە کەسێکی بەختەوەر و سعید بێت لە دنیا دا و تام چێژی ئەو ئیمانە بکات کە لە دلی کەسی مزکی هەیە

لەبەر ئەوەی ئەو نەفسە حەقی هەیە بەسەر موسڵمانەوە هەر وەک رسول الله صل الله علیه و سلم دەفەرموێت: (وإنَّ لنفسِك عليك حقاًّ)[١]

واتە: نەفس حەقی هەیە لەسەر تۆ

نابێت نەفس وابزانی پەروەردەی بەوەیە کە تەواو زەخت لە نەفسی خۆت بکەیت و سنوری شەرع تێپەڕێنیت و توند بیت لەسەر نەفست، ئەم تەزکیەیە کە کارێکی زۆر گرنگە پێویستە ئینسان ئاگاداری بێت و زیادەرەوی نەکا و شلڕەویش نەبێ لەگەلی، بەلکو تەزکیی نەفس دەبێ ڕێگە شەرعیەکانی لەگەڵ

(١):رواه بخاری

بەکار بیەنی ئەو ڕێگایانەی کە بۆمان باس کراوە بەو شێوەی نە بیکوژین وە  بەری بدەین و ئیهمالی کەین، بەو جۆرەی رسول اللە صل اللە علیە و سلم بۆی باس کردوینە پێوەی خەریک بین.

هەولدەم لەو کتێبە بچوکە لەو ١٠ خالەدا تەزکیەتان بۆ باس بکەم وەنەبێ لەو ١٠ خالەدا کۆ ببێتەوە بە مانایەک تەنیا ئەو ١٠ خالە بێت بەلکو زیاترە ، ئەم ١٠ خالە وا دەکا کە یارمەتی دەری بێت بۆ تەزکیەی نەفسی بۆ پاکردنەوەی بۆ گەشە پێدانی بۆ پاراستنی...

داوا ئەکەین لە اللە تەزکیەی نەفسمان کات، هاتوینە اللە تعالی کردەوەکانمان الاصلاح و چاک بکا بەهۆی کردەوە کردن بە سونەتی رسول اللە صل اللە علیە و سلم، وە داوا دەکەین هەر قسەیە دەکەین متابقی قورئان و سونەت بێت ، وە داوای باشترین و جوانترین تەزکیەت لێ دەکەین، وە داوات لێ دەکەین لە خراپترین و ناشرینترین  نەفەکان بمان پارێزیت، وە بمان پارێزە و دورمان بەرەوە لە فیتنەی شبهات و شهوات....

# بنەمای یەکەم

**{تەوحید ئەصل و بنچینەی هەموو ئەو شتانەیە کە ئەبێتە هۆی تەزکیەی نەفس و پاکبوونەوەی دڵ و دەروونەکان}**

بەدڵنیاییەوە تەوحید بریتییە لەو مەبەست و ئامانجەی کە الله سبحانە وتعالی ئێمەی لە پێناویدا درووست کردووە و هێناوەتە بوون،

هەروەکو چۆن الله تعالی فەرموویەتی : ﴿ وَمَا خَلَقْتُ الْجِنَّ وَالْإِنسَ إِلَّا لِيَعْبُدُونِ ﴾ **الذاريات:٥٦**

واتە : ﴿ وە من جنۆکە و ئادەمیزادم تەنها بۆ ئەوە دروست کردووە کە بەندایەتی من بکەن ﴾.

وە هەروەها تەوحید ئەرکی هەموو پێغەمبەر و نێردراوەکان بووە , هەروەکو چۆن الله تعالی فەرموویەتی:

﴿وَلَقَدْ بَعَثْنَا فِي كُلِّ أُمَّةٍ رَّسُولًا أَنِ اعْبُدُوا اللَّهَ وَاجْتَنِبُوا الطَّاغُوتَ﴾النحل:٣٦

واته : ﴿ سوێند بە اللە , لەناو هەموو گەل و ئوممەتێکدا پێغەمبەرێکمان ناردووە بۆ ئەوەی تەنها اللە بپەرستن و دوور بکەونەوە لە ( پەرستنی هەموو جۆرە ) طاغوتێک ﴾.

وە تەوحید یەکەمین شتێکە کەوا لەسەر مرۆڤەکان واجب کراوە بۆ هاتنە ناو ئیسلامەوە , وە بەهەمان شێوە یەکەمین شتێکە کەوا لەسەر ئینسانی داعی و بانگخواز واجبە کە بانگەوازی بۆ ڕێگای اللە عز وجل دەکات کە لەپێش هەموو شتێکدا خەڵکی فێری تەوحید بکات......

هەروەکو چۆن پێغەمبەر ( صلی اللە علیە وسلم ) کاتێک معاذی بۆ یەمەن نارد پێی فەرموو : { بەڕاستی ئێستا تۆ ئەچیتە

لاى قەومێک لە ئەهلى کتاب , جا لە سەرەتادا بانگەوازيان بکە بۆ ئەوەى کە الله تعالى بە تاک و تەنها بپەرستن}.[١]

وە الله تعالى بەڵێنى عەزابێکى توندى داوە لە ڕۆژى قيامەتدا بۆ ئەوانەى کە نەفسى خۆيان پاک ناکەنەوە بە تەوحيد و ئيمان،

الله تعالى فەرموويەتى : ﴿ ... وَوَيْلٌ لِّلْمُشْرِكِينَ * الَّذِينَ لَا يُؤْتُونَ الزَّكَاةَ وَهُم بِالْآخِرَةِ هُمْ كَافِرُونَ ﴾**فصلت :٦-٧**

واتە : ﴿ وە سزاو لەناوچوون بۆ موشريکەکانە * ئەوانەى کە دڵ و دەروونى خۆيان پاک ناکەنەوە و باوەڕيشيان بە ڕۆژى دوايى نييە ﴾.

*ئيمامى ابن تيمية ـ رحمە الله تعالى ـ لە تەفسيرى ئەو ئايەتەدا فەرمويەتى : {ئايەتەکە مەبەست پێى ئەو تەوحيد و ئيمانەيە

---

(١):صحيح البخارى : 7372

که ئەبێته هۆی پاك کردنەوەی دڵ و دەروون , که ئەویش نەفی کردنی هەموو ئیلاهێك لەخۆی ئەگرێت جگه له ئیلاهی حەق نەبێت له دڵدا , وه تەنها إثبات کردنی ئیلاهی حەق له دڵدا , ئا ئەمەش بریتییه له حەقیقەتی " لا إله إلا الله " , وه هەروەها ئەمه ئەصلی هەموو ئەو شتانەیه که دڵ و دەروونەکان پاك ئەکاتەوە}. (١)

*وه ئیمامی ابن القیم ـ رحمه الله تعالی ـ فەرموویەتی : { زۆربەی موفەسیران له سەلەف و لەوانەی دوای ئەوانیشەوە فەرموویانه : مەبەست له ( لَا يُؤْتُونَ الزَّكَاةَ ) تەوحیده , شەهادەی : لا إله إلا الله , وه ئەو ئیمان و باوەڕەیه که دڵ و دەروون پاك ئەکاتەوە... , که ئەویش ئەصلی هەموو پاك کردنەوە و گەشەکردنێکه؟}. (٢)

---

(١):مجموع الفتاوی : ١٠/٩٧

(٢):إغاثة اللهفان : ١/٧٩

جا هەروەکو چۆن تەوحید بریتییە لەو ئەصل و بنچینەیەی کە دڵ و دەروونەکان تەزکیە ئەکات و پاکیان ئەکاتەوە , ئەوا بەهەمان شێوە شیرک و هاوبەش بڕیاردانیش پیسترین شتێکە کە دڵ و دەروونەکان پیس ئەکات و لەناوی ئەبات , بەڵکو هەڵوەشێنەرەوەی هەموو کردەوە چاکەکانیشە،

هەروەکو چۆن الله تعالی فەرموویەتی : ﴿ وَلَقَدْ أُوحِيَ إِلَيْكَ وَإِلَى الَّذِينَ مِن قَبْلِكَ لَئِنْ أَشْرَكْتَ لَيَحْبَطَنَّ عَمَلُكَ وَلَتَكُونَنَّ مِنَ الْخَاسِرِينَ ﴾**الزمر:٦٥**

واتە : ﴿ سوێند بە الله , نیگا کراوە بۆ تۆ وە بۆ پێغەمبەرانی پێش تۆش , کە ئەگەر هاوبەش بۆ الله دابنێی ئەوە بەڕاستی کردەوەکانت هەڵدەوەشێتەوە و ئەچیتە ڕیزی زەرەرمەندانەوە ﴾

وه شیرک بریتییە لەو تاوانەی کە الله تعالی هەرگیز لەو کەسە خۆش نابێت کە لەسەر شیرک مردووە،

هەروەکو چۆن الله تعالی فەرموویەتی : ﴿ إِنَّ اللَّهَ لَا يَغْفِرُ أَن يُشْرَكَ بِهِ وَيَغْفِرُ مَا دُونَ ذَٰلِكَ لِمَن يَشَاءُ ﴾**النساء: ٤٨**

واتە : ﴿ بەڕاستی الله خۆش نابێت گەر هاوبەشی بۆ دابنرێت , بێجگە لەوە خۆش ئەبێت لە هەر گوناهێکی تر بۆ هەرکەسێک کە بیەوێت ﴾.

وە الله تعالی بەهەشتی حەرام کردووە لەسەر هەرکەسێک کە شەریک و هاوبەش لەگەڵ الله دا بڕیار ئەدات،

هەروەکو چۆن الله تعالی فەرموویەتی : ﴿ إِنَّهُ مَن يُشْرِكْ بِاللَّهِ فَقَدْ حَرَّمَ اللَّهُ عَلَيْهِ الْجَنَّةَ وَمَأْوَاهُ النَّارُ ۖ وَمَا لِلظَّالِمِينَ مِنْ أَنصَارٍ ﴾**المائدة: ٧٢**

واته : ﴿ بەڕاستی هەرکەس هاوبەش بۆ اللە دابنێ ئەوە بێگومان اللە بەهەشتی لێ حەڕام کردووە , وە جێ و شوێنی ئاگر دەبێت , وە بۆ ئەو ستەمکارانە هیچ یارمەتیدەرێک نییە﴾.

جا ئەگەر بەندە بوو بە کەسێکی موەحید ئەوا پاک بوونەوەی تەواوی لە هەموو شتێکدا بەدەست هێناوە , وە هیدایەت و سەلامەتی تەواوی لە دونیا و قیامەت بەدەست هێناوە،

هەروەکو چۆن اللە تعالی فەرموویەتی:﴿الَّذِينَ آمَنُوا وَلَمْ يَلْبِسُوا إِيمَانَهُم بِظُلْمٍ أُولَـٰئِكَ لَهُمُ الْأَمْنُ وَهُم مُّهْتَدُونَ﴾**الأنعام:٨٢**

واته : ﴿ ئەوانەی کە بڕوایان هێناوە و بڕواکەیان تێکەڵ بە ستەم ( هاوەڵ دانان ) نەکردووە , هێمنی و ئاسایش تەنها بۆ ئەوانەیە و هەر ئەوانەش ڕێنمایی کراوون ﴾ .

جا کاتێک بەندە لە ملکەچ بوون و خۆشویستنی بۆ الله تعالی دڵسۆز و موخلیص بوو , ئەوا تەواوی کردەوەکانیشی بە ئیخڵاصی و دڵسۆزی و پاکیەوە ئەبێت , وە نەفسی خۆشی پاک و چاک کردووەتەوە , وە هەرکاتێکیش شتێک لە پیسیەکانی شیرک ئەخاتە ناویەوە و تێکەڵی ئەکات ئەوا بە ئەندازەی ئەو پیسی و گومڕاییە دڵ و دەروونی تێوەگلاندووە.

جا هیچ پاک بوونەوەیەک بۆ دڵ و دەروونەکان نییە ئیللا بە تەحقیق کردنی تەوحید نەبێت , وە بە تاک دانانی الله تعالی لە هەموو عیبادەتەکان , وە بە هەبوونی ئیخڵاص لە ئەنجام دانی کردەوەکان،

هەروەکو چۆن الله تعالی فەرموویەتی : ﴿ أَلَا لِلَّهِ الدِّينُ الْخَالِصُ ﴾الزمر: ٣

واتە : ﴿ ووریابە! ئایینی پاک و چاک و بێگەرد تەنها هی الله یە ﴾.

کەواتە هیچ پاک بوونەوەیەک بۆ دڵ و دەروونەکان نییە ئیللا بە پاک کردنەوەی نەبێت لە هەموو جۆرەکانی شیرک , وە بە پاک کردنەوەی نەبێت لە هەموو ئەو شتانەی کە هەڵوەشێنەرەوەی تەوحیدە و لاوازی ئەکات.

# بنەمای دووەم

## { دوعا و پاڕانەوە کلیلی تەزکیەی نەفس و پاک کردنەوەی دڵ و دەروونەکانە }

*پێغەمبەر ( صلى الله عليه وسلم ) فەرموویەتی : {ليسَ شيءٌ أكرمَ علَى اللَّهِ من الدُّعاءِ}.[(١)]

واتە : {هیچ شتێک نییە بەڕێزتر بێت لەلای الله تعالی لە دوعا و پاڕانەوە}.

بۆیە دوعا و پاڕانەوە لە چاکترینی عیبادەتەکانە لەلای الله تعالی , چونکە لە دوعادا بەندە بێ دەسەڵاتی و خۆبەکەم زانینی خۆی دەرئەخات بۆ الله تعالی , وە خۆی بە ملکەچ و

(١):أخرجه الترمذي : ٣٣٧٠

شكاوی ئەبینێت لە بەرامبەر الله تعالی , وە تیایدا دان ئەنێت بە هەموو هێز و توانا و قودرەتێکی الله تعالی...

*وە دوعا کاریگەریەکی گەورەی هەیە لە بوونەوەی دەرگاکانی خێر بەسەر بەندەدا , هەروەکو چۆن شیخ الإسلام کاتێک وەسیەتی أبو قاسمی مەغریبی ئەکات پێی دەفەرموێت : {دوعا و پاڕانەوە کلیلی هەموو خێرەکانە}. [(١)]

چونکە لە دوعادا ئومێدی هەموو خێرێک ئەکەیت بۆ نەفسی خۆت و داوای چاکە و خێری دونیا و قیامەتی تێدا ئەکەیت , جا داوا لە الله تعالی بکە و ئومێدت هەبێت لە بەدەست هێنانی و گیرابوونیدا،چونکە الله تعالی بەڵێنی وەڵامدانەوەی دوعای ئەو کەسانەی داوە کە لێی ئەپاڕێنەوە و هانای بۆ ئەبەن و ئومێدیان پێی هەیە ،

---

(١):مجموع الفتاوى : ١٠/٦٦١

الله تعالى فەرموويەتى: ﴿ وَقَالَ رَبُّكُمُ ادْعُونِي أَسْتَجِبْ لَكُمْ ﴾غافر: ٦٠

واتە : ﴿ پەروەردگارتان فەرموويەتى : داوام لێ بكەن و لێم بپاڕێنەوە , منیش وەڵامتان ئەدەمەوە ﴾ .

*ئیمامى عومەرى كوڕى خەطاب ـ الله لێى ڕازى بێت ـ فەرموويەتى : {من خەمى وەرگیرانى پاڕانەوەكەم هەڵناگرم , بەڵكو خەمى دوعاكردنەكەم هەڵدەگرم , چونكە ئەگەر دوعاكە ئاسوودەیى خستە دڵمەوە ئەوا گیرابوونیشى لەگەڵ ئەبێت}.[١]

(١):أخرجه الترمذي في جامعه : ٣٣٧٠

*مطرفی کوڕی عبد الله ـ رحمه الله تعالی ـ فەرموویەتی : { بیرم کردەوە چ شتێک کۆکەرەوەی چاکەکانە , ئەگەر چاکەیەکی زۆر لە یەک کاتدا هەبێت , وەکو ڕۆژوو و نوێژ , وە ئەگەر خێرێک بە دەست الله تعالی بێت و تۆش نەتوانی بەدەستی بهێنی ئیللا ئەگەر داوای لێ بکەیت و ئەویش پێت ببەخشێت , ئەوە کەواتە دوعا و پاڕانەوە کۆکەرەوەی هەموو خێرەکانە}.[١]

*وە لە بابی تەزکیەوە بە صەحیحی ڕیوایەت کراوە لە پێغەمبەرەوە ( صلى الله عليه وسلم ) کەوا لە دوعا و پاڕانەوەکانیدادەیفەرموو:

(١):أخرجه الإمام أحمد في الزهد : ١٣٤٤

{اللهمَّ آتِ نفسي تقواها ، وزكِّهَا أنت خيرُ من زَكَّاهَا ، أنت وَلِيُّهَا ومولاها}[١]

واته : {يارب تەقوا بە نەفسم ببەخشە , وە پاكى بكەرەوە هەر تۆ بە باشترين شێواز پاكى ئەكەيتەوە , وە هەر تۆى كە سەرپەرشتى ئەكەيت}.

لەم دوعـــــايەدا ئامـــــاژە و ئاگـــــاداركردنەوە هەيە لەســــــەر ئەوەى كە تەزكـــــــيەى نەفـــــس و پـــــاكبوونەوەى دڵ و دەروونەكـــــان تەنهـــــا بەدەســـــت الله تعـــــالى ى زانـــــا بە نهێنيەكـــــانە , وە گـــــەورەترين كلـــــيلى هەيە كە ئەويـــــش بە دەســـــت هێنـــــانى بـــــە دوعـــــــــا و پـــــــــــارِانەوەيە لە الله تعـــــــــــالى..

---

(١):أخرجه مسلم : ٢٧٢٢

*هەر بۆیە زۆربەی دوعاکانی پێغەمبەر ( صلی اللّٰه علیه وسلم ) بریتی بووە لە:

**{یا مقلب القلوب ثبت قلبي على دينك}**

واتە : {ئەی ئەو زاتەی کە دڵەکان هەڵدەگێڕێتەوە , دڵم جێگیر بکە لەسەر دینەکەت}.

جا هەرکاتێ بەندە دڵی کۆبوویەوە و ئامادەبوو لەکاتی دوعادا , وە هەرکاتێ ڕاستی پێویستی و داواکاریەکەی و بەهێزی ڕەجاء و ئومێد و پەلەنەکردن لە وەڵامدانەوەی و باشترینی کاتەکان بۆ دوعا کۆبوونەوە بەیەکەوە , ئەوە بەڕاستی ئەستەمە ڕەت بوونەوەی ئەم دوعایە.

وە گەورەترین شتێک کە ئەبێتە یارمەتیدەر بۆت لەسەر ئەو جۆرە دوعا و پاڕانەوەدا ئەوەیە کەوا بزانیت تەزکیە و پاک

بوونەوەی نەفست تەنها بەدەست الله تعالی یە , چونکە تەنها الله یە کە دڵ و دەروونەکان پاک ئەکاتەوە بۆ هەر کەسێ خۆی بیەوێت , وە زانینی ئەوەشی کە هەموو کارو بارەکان تەنها بەدەست ئەوە و لەژێر ویست و مەشیئەتی ئەو دایە.

هەروەکو چۆن الله تعالی دەفەرموێت : ﴿ بَلِ اللَّهُ يُزَكِّي مَن يَشَاءُ ﴾**النساء ٤٩**

واتە : ﴿ بەڵکو الله تعالی دڵ و دەروونی هەرکەسێک خۆی بیەوێت پاکی ئەکاتەوە ﴾ .

هەروەها فەرموویەتی : ﴿ وَلَوْلَا فَضْلُ اللَّهِ عَلَيْكُمْ وَرَحْمَتُهُ مَا زَكَىٰ مِنكُم مِّنْ أَحَدٍ أَبَدًا وَلَـٰكِنَّ اللَّهَ يُزَكِّي مَن يَشَاءُ ﴾**النور ٢١**

واتە : ﴿ ئەگەر بەهرەو میهرەبانی الله نەبوایە بەسەرتانەوە

هەرگیز کەسێ لە ئێوە پوخت و پاک نەدەبۆوە , بەڵام الله هەرکەسی بوێت ( شیاوبێ ) پاکی دەکاتەوە ﴾

*ئیمامی ابن عباس لە تەفسیری ئەم ووتەیەی الله تعالی : ( مَا زَكَىٰ مِنكُم ) فەرموویەتی : {یانی هیچ کەسێک لە تەواوی درووستکراوەکان هیدایەت نەئەدران بۆ شتێکی خێر تاکو سوود بە نەفسی خۆیان بگەیەنن , وە لە هیچ شەڕ و خراپەیەک خۆیان نەئەپاراست تا لە نەفسی خۆیان دووری بخەنەوە}.[١]

واتە : هەموو ئەمانە تەنها و تەنها فەزڵی الله یە بەسەر بەندەکانیەوە.

(١):تفسير الطبري : ١٧/٢٢٢

*بەڕاء دەفەرموێت : {رسول الله ( صلى الله عليه وسلم ) له ڕۆژی ئەحزابدا گڵ ی لەگەڵ دەگواستینەوە و خۆڵ سپێتی سکی داپۆشیبوو , وە دەیفەرموو:

واللَّهِ لَوْلَا اللَّهُ ما اهْتَدَيْنَا... ولَا تَصَدَّقْنَا ولَا صَلَّيْنَا

واته : سوێند به الله ئەگەر الله تعالى نەبووایە ڕێی ڕاستمان نەئەگرت،وە خێر و چاکە و نوێژمان نەدەکرد}[1]

جا هیدایەت و ئیمان و خێر هەر هەمووی تەنها به دەست الله یه , وە پێغەمبەر ( صلى الله عليه وسلم ) ئەم شتەی له دڵ و دەروونی هاوەڵەکانی چاندبوو , وە هەمیشه ئەمەی بۆ دووپات ئەکردنەوە و له پێشەکی ووتاریدا دەیفەرموو:

{من يهده الله فلا مضل له ، ومن يضلل الله فلا هادي له}

---

(١):متفق عليه

جا ئەم ئەصل و بنچینەیە یەکێکە لە گەورەترینی دەرگاکان بۆ تەزکیەی نەفس , چونکە بەندە کاتێک زانی کەوا چاک بوونی نەفسی و پاک بوونەوەی و ئیستقامەی تەنها بە دەست اللہ یە , ئەوا لێی ئەپاڕێتەوە و هانای بۆ ئەبات , وە ڕووئەکاتە ئەو دەرگایە و ئیلحاح ئەکات لە دوعا و پاڕانەوەدا , بە ئومێد و طموعەوە , تاوەکو تەزکیەی نەفسی و پاک بوونەوەی دڵ و دەرووونی بەدەست بهێنێت و ڕزگار و سەرفراز بێت لە دونیا و قیامەتدا.

# بنەمای سێیەم

## {قورئانی پیرۆز سەرچاوە و ئەصلی تەزکیەی نەفسە}

الله سبحانە وتعالی دەفەرموێت : ﴿ لَقَدْ مَنَّ اللَّهُ عَلَى الْمُؤْمِنِينَ إِذْ بَعَثَ فِيهِمْ رَسُولًا مِّنْ أَنفُسِهِمْ يَتْلُو عَلَيْهِمْ آيَاتِهِ وَيُزَكِّيهِمْ وَيُعَلِّمُهُمُ الْكِتَابَ وَالْحِكْمَةَ ﴾آل عمران: ١٦٤

واتە : ﴿ سـوێند بێـت , بێگـومان الله منـەتی ناوەتـە سـەر ئیمانداران کاتێک کەوا پێغەمبەرێکی بۆ رەوانە کردوون لە خۆیان کە ئایەتەکانی ئەویان بەسەردا دەخوێنێتەوە , وە دڵ و دەروونیان پاک و پوخت دەکاتەوە , هەروەها فێری قورئـان و دانایـان دەکـات﴾

گەورەترین شتێک کەوا هۆکارە بۆ تەزکیەی نەفس و پاک بوونەوەی دڵ و دەروونەکان بریتییە لە قورئان , ئەو قورئانەی کە بریتییە لە کتاب و مەنبەع و سەرچاوە و هەڵقوڵاو و مەصدەر بۆ تەزکیە , کەواتە هەرکەسێک ئەیەوێت نەفس و دڵ و دەروونی خۆی پاک بکاتەوە ئەوا با دەست بە کتابی الله تعالی بگرێت و پاک بوونەوەی دڵ و دەروونی لە قورئان بدۆزێتەوە.

*ئیمامی ابن عەباس ـ الله لێی ڕازی بێت ـ فەرموویەتی : « الله سبحانە وتعالی زامنی کردووە بۆ ئەو کەسەی کەوا شوێنی قورئان ئەکەوێت بەوەی کە لە دونیادا گومڕا نەبێت و لە قیامەتیشدا ناخۆشی و نارەحەتی نەیەتە ڕێی , پاشان ئەم ئایەتەی خوێندەوە:﴿ فَمَنِ اتَّبَعَ هُدَايَ فَلَا يَضِلُّ وَلَا يَشْقَىٰ ﴾(١)

---

(١):أخرجه ابن أبي شيبة في المصنف : ٣٥٩٢٦

واته :{ ئەوەی شوێنی هیدایەتی من بکەوێت ئەوا نە گومڕا ئەبێت و نە ناخۆشی و نارەحەتی دێتە ڕێی}.

وە الله تعالی فەرموویەتی : ﴿ يَا أَيُّهَا النَّاسُ قَدْ جَاءَتْكُم مَّوْعِظَةٌ مِّن رَّبِّكُمْ وَشِفَاءٌ لِّمَا فِي الصُّدُورِ وَهُدًى وَرَحْمَةٌ لِّلْمُؤْمِنِينَ ﴾ **یونس: ٥٧**

واته : ﴿ ئەی خەڵکینە , بەڕاستی ئێوە ئامۆژگاریەکی گەورە و گرنگتان لەلایەن پەروەردگارتانەوە بۆ هاتووە کە ( قورئانە ) وە شیفا و چارەسەریشە بۆ نەخۆشی دڵ و دەروونەکان و ڕێ نیشاندەرو ڕەحمەتیشە بۆ ئیمانداران ﴾.

*ئیمامی ابن القیم ـ رحمه الله تعالی ـ دەفەرموێت : « قورئان شـیفا و چارەسـەری تەواوە بـۆ هەمـوو نەخۆشـیەکی دڵ و دەروون و جەسـتەیی " قەلـبی و بەدەنی " وە بـۆ هەمـوو نەخۆشـیەکانی دونیـا و ئاخـیرەت}.[1]

---

(١):زاد المعاد : ١١٩/٤

وە الله تعالی دەفەرموێت : ﴿ الَّذِينَ آتَيْنَاهُمُ الْكِتَابَ يَتْلُونَهُ حَقَّ تِلَاوَتِهِ أُولَـٰئِكَ يُؤْمِنُونَ بِهِ ﴾**البقرة: ١٢١**

واتە : ﴿ دەستەیەک لەوانەی کتێبمان پێ بەخشیون ( قورئان ) بە چاکی و بەوردی دەوری دەکەنەوە , ئەوانە باوەڕیان پێی هەیەو باوەڕی پێ دەهێنن ﴾

جا مەبەست لە ( يَتْلُونَهُ حَقَّ تِلَاوَتِهِ ) : بریتییە لە خوێندنەوە و لەبەرکردنی قورئان , وە تێگەیشتن لە ماناکانی و تەدەبور و ووردبوونەوە لە ئایەتەکانی , وە کار کردن بەو ئەمر و نەهیانەی کە لە قورئان هاتووە , هەروەکو چۆن صەحابە و تابعین بەم شێوەیە تەفسیریان کردووە.

*ئیمامی ابن مسعود ـ الله لێی ڕازی بێت ـ فەرموویەتی : {ئەگەر یەکێ لە ئێمە فێری دە ئایەت بووایە , نەئەچوو بۆ سەر ئایەتی

تر هەتاوەکو ئەم دە ئایەتەی بە چاکی شارەزا ئەبوو لە ماناکانیان و کاری پێیان ئەکرد}. (١)

جا خوێندنەوەی قورئان بەبێ تێگەیشتن لە ماناکانی و بەبێ کارکردن بەو شتانەی کە لە قورئاندا هاتووە ئەوە بەمانای ئەو ( حق تلاوتە ) نایەت کە الله تعالى وەسفیانی کردووە.

*بۆیە فوضەیلی کوڕی عەیاض ـ رحمە الله تعالى ـ دەیفەرموو : « قورئان بۆ ئەوە دابەزیوە تا کارو کردەوەی پێ بکرێت , بەڵام لە ئێستادا خەڵکی خوێندنەوەیان کردووە بە کار پێ کردنی}. (٢)

جا ئەگەر الله تعالى بەندەیەکی خۆی ڕێزدار کرد بە خوێندنەوەی قورئان و تەدەبور کردن لێی و جیهاد کردنی

---

(١):أخرجه الإمام أحمد في المسند : ٢٣٤٨٢

(٢):أخلاق حملة القرآن : ٤١

نەفسى لەسەر کار پێ کردنى ئەوە بەڕاستى زۆرترين پشک و بەشى بەدەست هێناوە لە تەزکيەى نەفسيدا.

# بنەمای چوارەم

## {دانانی پێغەمبەر ( صلى الله عليه وسلم ) بە پێشەنگ و ڕابەر}

الله سبحانه وتعالى دەفەرموێت : ﴿ لَّقَدْ كَانَ لَكُمْ فِي رَسُولِ اللَّهِ أُسْوَةٌ حَسَنَةٌ لِّمَن كَانَ يَرْجُو اللَّهَ وَالْيَوْمَ الْآخِرَ وَذَكَرَ اللَّهَ كَثِيرًا ﴾الأحزاب: ٢١

واتە : ﴿ سـوێند بـە الله بەڕاسـتی لـە پێغەمبـەری الله ـدا چـاکترین نموونـەی تـەواو ڕێـک و پێـک هەیـە تـا چـاوی لێ بکـەن و شـوێنی بکـەون , بەتایبـەت بـۆ ئـەو کەسـانەی ڕەزامەندی الله یان مەبەستە و سـەرفرازی قیامەت ئاواتیانە , وە هەمیشـە و بـەردەوام یـادی الله بـە زۆری ئەنجـام ئـەدەن و زمانیـان پـاراوە بـە یـادی ئـەو ﴾

*ئیمامی ابن کثیر ـ رحمه الله تعالی ـ دەفەرموێت : {ئەم ئایەتە بەڕێزە ئەصل و بنچینەیەکی مەزنە تاوەکو ئیمانداران رسول الله ( صلی الله علیه وسلم ) بکەن بە سەرمەشقی خۆیان لە هەموو گوفتار و کردار و هەڵسوکەوتێکیدا}.(١)

*وە ئیمامی حەسەنی بەصری ـ رحمه الله تعالی ـ دەفەرموێت : « هەندێک کەس لە سەردەمی پێغەمبەردا ( صلی الله علیه وسلم ) ئەیانوت : ئێمە پەروەردگارمان خۆش ئەوێت , الله تعالی ش ئەم ئایەتەی دابەزاند : ﴿ قُلْ إِن كُنتُمْ تُحِبُّونَ اللَّهَ فَاتَّبِعُونِي يُحْبِبْكُمُ اللَّهُ ﴾ واتە : ئەی پێغەمبەر ( صلی الله علیه وسلم ) بڵێ : ئەگەر ئێوە الله تان خۆشئەوێت ئەوا شوێنی من بکەون تا الله ش ئێوەی خۆش بوێت}(٢)

(١):تفسیر ابن کثیر : ١١/١٣٣

(٢):تفسیر الطبري : ٣٢٢/٦

کەواتە شوێنکەوتنی پێغەمبەر ( صلی اللہ علیه وسلم ) و کردنی بە سەرمەشق بەڵگەیە لەسەر ڕاستگۆیی خۆشویستنی اللہ تعالی , چونکە شوێنکەوتنی و إقتداء پێ کردنی و ڕۆیشتن لەسەر مەنهەجە ڕاست و درووستەکەی بریتییە لە سەرچاوە و خودی تەزکیە , بۆیە بەندە ناتوانێت پێی بگات بەبێ شوێنکەوتنی ئەو پەیامەی کە پێغەمبەر هێناویەتی ( صلی اللہ علیه وسلم).

جا پێشەوایە گومڕاکان لە هەموو سەردەمێکدا چەندین ڕێبازی باطل و مونکەریان داهێناوە کە تیایدا بانگەشەی ئەوە ئەکەن کە ئەم ڕێگایەی دایانهێناوە هۆکارە بۆ تەزکیەی نەفس و پاک بوونەوەی دڵ و دەروونەکان , وە هۆکارە بۆ بەهێزکردنی پەیوەندی لەگەڵ اللہ دا , وە جگە لەمانەش لەو قسانەی کە ئەوترێت و ئەیکەن , وە وەصیەتی

خەڵکی ئەکەن بە دابڕان لە جەماعەت و مانەوە و خەلوەکردن لە شوێنە تاریکەکان , کە تیایدا چەند زیکرێکی تایبەت و ووشەیەکی دیاریکراوی تیا ئەنجام ئەدەن , بە بانگەشەی ئەوەی کە ئەمانە ئەبنە هۆکار بۆ تەزکیە و پاک بوونەوە و پێگەیاندنی دڵ و دەروون و چەندین بانگەشەی تری باطل.

*ئیمامی ابن القیم ـ رحمه الله تعالی ـ دەفەرموێت : {تەزکیەی نەفس زۆر قورستر و نارەحەتترە لە چارەسەرکردنی جەستە , جا هەرکەسێک بیەوێت لەڕێی ئەو مەشق و تێکۆشان و خەلوەیەی کە پێغەمبەران نەیانهێناوە تەزکیەی نەفسی خۆی بکات ئەوە وەکو ئەو کەسە نەخۆشەیە کە ئەیەوێت بە عەقڵ و بۆچوونی خۆی چارەسەری خۆی بکات , جا عەقڵ و بۆچوونی ئەو لەکوێی زانستی دکتۆر دایە؟ ,

بەهەمان شێوە پێغەمبەرانیش ( علیهم السلام ) دکتۆری دڵانن , وە هیچ ڕێچکە و ڕێگایەک بوونی نییە بۆ تەزکیەی نەفس و پاک کردنەوە و چاک کردنی دڵ و دەروونەکان ئیلا بە دەست گرتن نەبێت بە ڕێبازی پێغەمبەران , وە ئیلا لەسەر دەستی ئەوان نەبێت , وە بە تەواوترین و پاکترین شێوە ملکەچ و تەسلیمیان بێت , والله المستعان}.[١]

وە هەروەها تەواوی ئەو کردەوانەی کە فەرمانی پێغەمبەری ( صلی الله علیه وسلم ) لەسەر نییە ئەوا ڕەت ئەکرێتەوە بەسەر خاوەنەکەیدا،

*هەروەکو چۆن پێغەمبەر ( صلی الله علیه وسلم ) فەرموویەتی : {من عمل عملًا لیس علیه أمرُنا فهو ردٌّ} [٢]

(١):مدارج السالكين : ٢/٣٠٠

(٢):صحيح مسلم: ١٧١٨

واتە : {هەرکەسێک هەر کردەوەیەک بکات , وە ئەو کردەوەیە ئەمری ئێمەی لەسەر نەبێت ( واتە: بە پێی سوننەتی من نەبێت ) ئەوا لێی قەبوڵ ناکرێت و ڕەت ئەکرێتەو}, واتە: ڕەت ئەکرێتەوە بەسەر خاوەنەکەیدا.

*ئیمامی سفیانی کوڕی عیینة ـ رحمە اللّٰە تعالی ـ فەرموویەتی : {پێغەمبەر ( صلی اللّٰە علیە وسلم ) گەورەترین پێوەر و میزانە بۆ ئینسانی موسڵمان , بۆیە پێویستە هەموو شتەکان بە گوێرەی سوننەتی ئەو بەراورد بکرێن , لە ڕەوشت و سیرە و ژیان و هیدایەتەکەیدا , جا هەرشتێک موافقی بوو ئەوە حەق و ڕاستیە , وە هەرشتێکیش پێچەوانەی بێت ئەوە باطل و پوچە}.(١)

(١):الجامع لأخلاق الراوي : ١/٧٩

کەواتە واجبە لەسەر هەرکەسێک کە تەزکیە و پاک بوونەوەی ئەوێت بۆ دڵ و دەروونی خۆی ئەوا با جیهادی نەفسی بکات لەسەر شوێنکەوتن و ئیقتداء کردن و بە سەرمەشق دانانی پێغەمبەر ( صلی اللە علیە وسلم ) , وە حەزەر بکات و خۆی بپارێزێت لە بیدعە و داهێنراوەکان و ئەو ڕێچکە بیدەعیانەشی کە تیایدا بانگەشە ئەکەن بۆ تەزکیەی نەفس و پاک بوونەوەی دڵەکان.

# بنەمای پێنجەم

## {تەزکیەی خۆ خاڵی کردنەوە و خۆ ڕازاندنەوە ـ التخلية و التحلية}

حەقیقەتی تەزکیەی نەفس بریتییە لە : خاڵی کردنەوە و پاک کردنەوەی نەفس لە سەرەتادا لەهەرچی کردەوەی خراپە و مەعصیەت و تاوان هەیە , پاشان لەدوای هەموو ئەمانە خۆ ڕازاندنەوەیە بە ئەنجام دانی کردەوەی چاکە و طاعەت و هەر کردەوەیەک کە لە الله تعالی نزیکت ئەکاتەوە،

هەروەکو چۆن الله تعالی دەفەرموێت : ﴿ خُذْ مِنْ أَمْوَالِهِمْ صَدَقَةً تُطَهِّرُهُمْ وَتُزَكِّيهِم بِهَا وَصَلِّ عَلَيْهِمْ ﴾**التوبة: ١٠٣**

واتە : ﴿ وەربگرە لەماڵ و دارایی یان سەدەقەیەک کە بەهۆیەوە پاکیان دەکەیتەوە ( لە گوناهـ ) و ( دڵیان ) پوخت و خاوێن دەکەیت بەو ماڵ بەخشینە , وە تۆش دوعا و نزای خێریان بۆ بکە.... ﴾.

الله تعالی لەم ووتەیەیدا لە سەرەتادا فەرمووی : ﴿ تُطَهِّرُهُمْ ﴾ ئاماژەکردنە بۆ مەقامی « التخلية » واتا خۆ خالّی کردن و خۆ خاوێن کردنەوە لە تاوانەکان بە پاکبوونەوەیان لە هەرچی گوناحە , ئینجا فەرمووی : ﴿ وَتُزَكِّيهِم ﴾ ئەمەشیان ئاماژەکردنی تیایە بۆ مەقامی « التحلية » خۆ جوان کردن و ڕازاندنەوە بە ئەنجامدانی کردەوەی چاکە و حەسەنات , جا پێشخستنی « التطهير » بەسەر « التزكية »دا بەڵگەیە لەسەر پێشخستنی « التخلية » بەسەر « التحلية »دا.

جا پێویستە لەسەر هەرکەسێک کە ئەیەوێت تەزکیەی نەفسی خۆی بکات ئەوە با لە سەرەتادا ئەو گوناح و تاوانانەی کە دڵی بۆگەن کردووە و ڕێگرە لە درەوشانەوەی نوری هیدایەت و ئیمان لە دڵدا ئەوا با ڕایماڵێت و پاکی بکاتەوە و ڕەگ و ڕیشەی هەڵکەنێت،

*هەروەکو چۆن پێغەمبەر ( صلى الله عليه وسلم ) فەرموویەتی : {إنَّ العبدَ إذا أخطأَ خطيئةً نُكِتت في قلبِهِ نُكْتةٌ سوداءُ ، فإذا هوَ نزعَ واستَغفرَ وتابَ سُقِلَ قلبُهُ ، وإن عادَ زيدَ فيها حتَّى تعلوَ قلبَهُ ، وَهوَ الرَّانُ الَّذي ذَكَرَ اللَّه : ﴿ كَلَّا بَلْ رَانَ عَلَى قُلُوبِهِمْ مَا كَانُوا يَكْسِبُونَ ﴾ }.(١)

واتە : « کاتێک بەندەیەک گوناح و تاوانێک ئەنجام ئەدات خاڵێکی ڕەش لەسەر دڵی درووست ئەبێت , جا ئەگەر تەوبەی

(١):أخرجه الترمذي في الجامع : ٣٣٣٤

كرد و پەشیمان بوویەوە لەو تاوانەی ئەنجامی داوە ئەوە ئەو خاڵەی سەر دڵیشی سپی ئەبێتەوە , بەڵام ئەگەر دووبارە گەڕایەوە بۆ سەر گوناح و تاوان و تەوبەی نەکرد ئەوا دڵی دائەپۆشرێت هەتا هەر هەمووی ڕەش ئەبێت و یەک خاڵی سپی تیا نامێنێتەوە , ئا ئەمەش ئەو ( الران ) یە کە اللہ تعالی باسی کردووە لە کتابەکەیدا و فەرموویەتی : ﴿ نەخێر وانییە بەڵکو ژەنگی ئەو ( خراپانەی ) کە دەیانکرد پەردەی هێناوە بەسەر دڵیاندا ﴾}.

لە پاشاندا جیهادی نەفسی خۆی بکات لەسەر زۆر ئەنجامدانی ئەو کردەوە چاکانەی کە ئەبێتە هۆی پاک کردنەوەی دڵ و دەروونی.

هەروەکو چۆن اللہ تعالی فەرموویەتی : ﴿ وَالَّذِينَ جَاهَدُوا فِينَا لَنَهْدِيَنَّهُمْ سُبُلَنَا ۚ وَإِنَّ اللَّهَ لَمَعَ الْمُحْسِنِينَ ﴾ **العنكبوت ٦٩**

واته : ﴿ وه كهسانێ كه له پێناو ڕهزامهندی ئێمهدا تێكۆشانیان كردووه بهڕاستی ڕێنموونیان دهكهین بۆ هەموو ڕێگەیەكی ڕاست و درووستی خۆمان , وه بێگومان الله لهگهڵ چاكهكاران دایه ﴾.

* ئیمامی ابن تیمیة ـ رحمه الله تعالى ـ فهرموویهتی : {ههرچهنده تهزكیه له ئهصلدا گهشهكردن و بهرهكهت و زیادكردنی خێر و كردهوه چاكهكانه , بهڵام ئهمهش به لابردن و نههێشتنی شهڕ و تاوانهكان بهدهست ئههێنرێت}....[1]

*ابن سعدي لهبارهی ئهم ووتهیهی الله تعالى : ﴿ بَلِ اللَّهُ يُزَكِّي مَن يَشَاءُ ,,, واته : بهڵكو الله تعالى دڵ و دهروونی ههركهسێك خۆی بیهوێت پاكی ئهكاتهوه ﴾ ,

(١):مجموع الفتاوى : ١٠/٩٧

فەرموويەتى : {واتا بە ئيمان و كردەوە چاكەكان پاكى ئەكاتەوە , بە خۆ خاوێن كردنەوە لە ئەخلاق و ڕەوشتى ناشيرين , وە بە خۆ ڕازاندنەوە بە صيفاتە جوانەكان}. [١]

---

(١):تيسير الكريم الرحمن : ١٨٢

# بنەمای شەشەم

**{داخستنی تەواوی ئەو دەروازانەی کە تەزکیە لە دڵی بەندە ئەباتە دەرەوە و دووری ئەخاتەوە لە کردەوە چاکەکان و ئەیخاتە ناوگوناح و تاوانەکان}**

بەندە پێویستیەکی تەواو زەروری هەیە بە داخستنی هەموو ئەو دەروازانەی کە ئەبێتە هۆی پیس بوونی نەفس و ژەنگ هەڵێنانی , وە لە سوننەتدا نموونەیەکمان بۆ هێنراوەتەوە کە باس لە ترسناکی چوونە ژوورەوەی ئەو دەرگا و دەروازانە ئەکات کە بەهۆیەوە بەندە دینەکەی لەدەست ئەدات.

*پێغەمبەر ( صلى اللە علیه وسلم ) فەرموویەتی : {اللّٰه تعالی نموونە بە ڕێگەیەکی ڕاست ئەهێنێتەوە , وە لە هەردوو تەنیشتی ئەم ڕێگا ڕاستە شوورە و دیوار دەورەی ڕێگاکەی

داوە و چەندین دەرگای والا کراویش هەیە , وە لەسەر هەموو دەرگاکانیش پەردە هەیە کە پیایدا هاتووەتە خوارەوە , وە لە سەرەتای ڕێگاکە داعی و بانگکەرێک هەیە کە دەڵێت : لەسەر ئەو ڕێگا ڕاستە بڕۆن و خوار مەبنەوە و بەهیچ لایەکدا لامەدەن , وە لەسەرووی ئەویشەوە بانگکەرێکی تر هەیە کە هەرکاتێک بەندەیەک بیەوێت تۆزێ لە یەکێ لە دەرگاکان بکاتەوە بانگی ئەکات و ئەڵێت : وەیل بۆ تۆ ! , مەیکەرەوە , چونکە ئەگەر بیکەیتەوە ئەچیتە ژوورەوەش , پاشان رسول الله ( صلى الله عليه وسلم ) تەفسیری ئەم نموونەیە ئەکات و دەفەرموێت : ئەو ڕێگا ڕاستە ئیسلامەکەیە , وە ئەو دەرگا والاکراوانەش حەڕام کراوەکانن , وە ئەو پەردەیەی کە پیایدا هاتبووە خوارەوە حدود و سنوورەکانی الله ن , وە ئەو داعی و بانگکەرەی کە لە سەرەتای ڕێگاکە بوو ئەوە قورئانە , وە ئەو داعیەشی کە

له سەرووى ئەو بوو ئامۆژگارى الله يه له دڵى هەموو ئيمانداريكدا}. (١)

*ئيمامى ابن رەجەبى حەنبەلى ـ رحمه الله تعالى ـ دەفەرموێت : {هەركەسێك له دونيادا بەردەوام نەبێت لەسەر ئەو ڕێگايه و لێى لابدات , وه بچێت دەرگاى ئەو حەڕام كراوانه بكاتەوه كه به پەرده داپۆشراون له ڕاست و چەپى ڕێگاكەدا و بچێته ژوورەوه , جا جياوازى نييه له دەرگاى حەڕامى شەهەواتەوه بێت يان له دەرگاى حەڕامى شوبوهاتەكانەوه بێت , ئەوه قولابى سەر پردى سيڕات دەيگرێت له ڕاست و چەپەدا , به گوێرەى ئەو دەرگا حەڕام كراوانەى كه كردوويەتيەوه و چووەته ناويەوه له دونيادا , جا هەيانه ڕايئەكێشێت و فڕێى ئەداته ناو ئاگر و هەشيانه قولابەكه هەر ئەيگرێت و ئەيكەوێنێت و بريندارى ئەكات تا ئەپەڕێتەوه}. (٢)

---

(١):موسنەدى ئيمامى أحمد : ١٧٩٠٩

(٢):مجموع رسائل : ١/٢٠٦

وه يەكێ لەو دەرگايانە , الله تعالى فەرموويەتى : ﴿ قُل لِّلْمُؤْمِنِينَ يَغُضُّوا مِنْ أَبْصَارِهِمْ وَيَحْفَظُوا فُرُوجَهُمْ ۚ ذَٰلِكَ أَزْكَىٰ لَهُمْ ۗ إِنَّ اللَّهَ خَبِيرٌ بِمَا يَصْنَعُونَ ﴾ النور: ٣٠

واتە : ﴿ ئەى (پێغەمبەر ( صلى الله عليه وسلم )) بڵێ بە پياوانى ئيماندار كە چاوى خۆيان ( لە سەير كردنى نامەحرەم ) داخەن و بپارێزن , وە عەورەتيان ( لە داوێن پيسى ) بپارێزن , ئەوە چاكتر و پاكترە بۆ ئەوان , بێگومان الله بە ئاگايە بە هەموو كردەوەيەك كە دەيكەن ﴾.

*أبو حيانى الأندلوسى . رحمه الله تعالى . فەرموويەتى : {لە ئايەتەكەدا پاراستن و داخستنى چاو پێش خستراوە بەسەر پاراستنى عەورەت , لەبەرئەوەى نەزەر گەيەنەر و هۆكارە بۆ تووش بوون بە زينا , وە پێشەنگى تاوان و فجورەكانە , وە ئەو كارەسات و بەڵايانەى كە لە نەزەردا هەيە سەختتر و زۆرترە}.(١)

(١):البحر المحيط : ٨/٣٣

*ابن سعدی لە تەفسیری ئەو ئایەتەدا دەفەرموێت : {چونکە هەرکەسێک عەورەت و چاوی خۆی بپارێزێت , ئەوا ئەوکەسە خۆی پاک و خاوێن ڕاگرتووە لە هەموو ئەو پیسیانەی کە فاحیشەچیەکان تێوەی گلاون , وە کردەوەکانی پاک و خاوێنن , ئەمەش بەهۆی وازهێنانی لەو حەڕامکراوەی کە نەفس ئارەزووی بۆ دەکات و بانگی ئەکات بۆ ئەم حەڕامە , جا هەرکەسێک شتێک واز لێ بهێنێت لەبەر الله , ئەوە الله تعالی بە چاکتر بۆی قەرەبوو ئەکاتەوە}.[١]

بـۆیە لە جـوانی ئیسـلامەتی بەنـدە ئەوەیە کە واز لە شـتێک بێنێت کە پەیوەندی پێیەوە نییە , لە زۆر قسـەکردن و زۆر نەزەرکـــــــــــردن و غەیـــــــــــری ئەمـــــــــــانەش .

---

(١):تیسیر الکریم الرحمن : ٦٦٠

*ئیمامی ابن القیم ـ رحمه الله تعالی ـ فەرموویەتی : {زۆربەی مەعصیەت و تاوانەکان لە زۆر قسەکردن و زۆر نەزەرکردن دێنە کایەوە , ئەم دوو تاوانە فراوانترین دەروازەی شەیتانەکانن , وە ئەم دوو ئەندامە نە ماندوو ئەبن و نە ئەوەستن}. (١)

جا لەسەر بەندە پێویستە کە ووریا بێت و داوای خۆڕاگری و سەبر و ڕزگاربوون لە الله تعالی بکات , وە ڕێ لە هەموو ئەو ڕێگایانە بگرێت کە ئەیبات بۆ لەدەست دانی نەفسی وە ئەیبات بۆ گوناح و تاوانەکان , چونکە سەرمایەی بەندە دینەکەیەتی , وە لەدەست دانیشی خەسارەت مەندبوونی دونیا و قیامەتە , بەتایبەت لەم سەردەمەی خۆماندا کە فیتنە تیایدا وەک باران بەسەر خەڵکیدا ئەبارێت , وە دەرگاکانی شوبوهات و شەهەواتی تیادا کراوەتەوە لەگەڵ هەبوونی ئەم

(١):بدائع الفوائد : ٢/٨٢٠

هەموو ئامراز و ئامێرانەی سەردەم و مەواقیعی شوبهاویە و بەرنامە مونحەریفانە , تا وای کردووە کە زۆربەی خەڵکی بەرەو گومڕایی ببات و لەو هیدایەتە دووری بخاتەوە , نسأل الله العافية.

# بنەمای حەوتەم

## {یادكردنەوەی مردن و گەیشتن بە لیقاء و دیداری اللہ عز وجل}

اللہ تعالى دەفەرموێت : ﴿ يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا اتَّقُوا اللَّهَ وَلْتَنظُرْ نَفْسٌ مَّا قَدَّمَتْ لِغَدٍ ﴾**الحشر: ١٨**

واتە : ﴿ ئەی ئەوانەی كە باوەڕتان هێناوە لە اللہ بترسن , وە هەموو كەسێك با سەرنج بدات ( بزانێ ) چی پێش خۆی ناردووە بۆ پاشەڕۆژی ﴾

*وە رسول اللہ ( صلى اللہ عليه وسلم ) دەفەرموێت : {أَكْثِرُوا ذكرَ هادِمِ اللذَّاتِ}(١)

---

(١):أخرجه ابن ماجه : ٤٢٨٥

واتە : « زۆر یادی لەناوبەری خۆشیەکان بکەنەوە » , کە مەبەست پێی مردنە.

مردن جیابوونەوەی بەندەیە لە ماڵی دونیا بۆ ماڵی ئاخیرەت , وە جیاکەرەوەیە لەنێوان کاتی کردەوە ئەنجامدان و پاداشت وەرگرتنەوە لەسەری , وە سنووری جیابوونەوەیە لەنێوان پێشخستنی توێشوو و گەیشتنەوە بە پاداشتەکەی , وە هیچ دەرفەت و مەجالێک بوونی نامێنێت لەدوای ئەودا بۆ تەوبە و إستغفارکردن لە تاوانەکان , وە هیچ دەرفەت و مەجالێکی تریش نامێنێت لەدوای ئەودا بۆ زۆرکردنی چاکەکان،

هەروەکو چۆن الله تعالی فەرموویەتی : ﴿ وَلَيْسَتِ التَّوْبَةُ لِلَّذِينَ يَعْمَلُونَ السَّيِّئَاتِ حَتَّىٰ إِذَا حَضَرَ أَحَدَهُمُ الْمَوْتُ قَالَ إِنِّي تُبْتُ الْآنَ ﴾**النساء: ١٨**

واته : ﴿ تەوبە و پەشیمانی بۆ ئەو کەسانە نییە کە بەردەوامن لەسەر گوناھ و تاوان , تا ئەوکاتەی مردن یەخەی بە یەکێکیان گرت ئەوسا بڵێت: ئەوە ئیتر من لە ئێستەوە تەوبەم کرد ﴾.

ئینجا ئەو مردنە مەحاڵە هیچ کەسێک هەبێت کە پێی نەگات , بەڵکو بەبێ هیچ شک و گومانێک هەموو نەفسێک بەو مردنە ئەگات،

هەروەکو چۆن الله تعالی فەرموویەتی : ﴿ قُلْ إِنَّ الْمَوْتَ الَّذِي تَفِرُّونَ مِنْهُ فَإِنَّهُ مُلَاقِيكُمْ ﴾**الجمعة: ٨**

واته : ﴿ پێیان بڵێ ئەی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) : بەڕاستی ئەو مردنەی کە ڕادەکەن لە دەستی هەر یەخەتان پێ دەگرێت و پێی ئەگەن ﴾،

وە هەروەها فەرموویەتی : ﴿ أَيْنَمَا تَكُونُوا يُدْرِككُّمُ الْمَوْتُ وَلَوْ كُنتُمْ فِي بُرُوجٍ مُّشَيَّدَةٍ ﴾**النساء: ٧٨**

واتە : ﴿ (دڵنیا بن) لە هەر کوێ بن مردن هەر یەخەتان پێ دەگرێت و پێی ئەگەن , با لەناو چەندەها قەڵاو شوێنی سەخت و قایمیشدا بن ﴾.

لەگەڵ هەموو ئەمانەشدا ئەو مردنە کت و پڕ و لەناکاو بۆ خەڵکان دێت وەک الله دەفەرموێت:﴿ فَإِذَا جَاءَ أَجَلُهُمْ لَا يَسْتَأْخِرُونَ سَاعَةًۖ وَلَا يَسْتَقْدِمُونَ ﴾**الأعراف: ٣٤**

واتە : ﴿ جا کاتێک کۆتایی تەمەنیان هات , ئەوە نە تاوێک دوا دەکەون نە تاوێکیش پێش دەکەون ﴾.

جا چەندین کەس هەبوون کاتێک کەوا لە ماڵەوە هاتووەتە دەرەوە و بە سەیارەکەی ڕۆیشتووە بەڵام لەسەر شانی کەسانی تر بە کفنەوە هاتووەتەوە ماڵەوە , ئەی چەندین کەسی تر هەبوونە کە بە خێزانەکەی وتووە ئەو

خواردنەم بۆ ئامادە بکە بەڵام مردن یەخەی پێ گرتووە و نەیخواردووە , وە ئەی چەندین کەس هەبوون کە کاتێ جلێکیان لەبەر کردووە و بە دەستی خۆیان قۆپچەکانیان داخستووە بەڵام مردوو شۆر قوپچەکانی بۆیان کردۆتەوە.

بەڕاستی لە یادکردنەوەی مردندا سوودێکی یەکجار گەورە هەیە بۆ بەندە , کە بەهۆیەوە دڵە بێ ئاگاکان بە ئاگادێنەوە و دڵە مردووەکان زیندوو ئەبنەوە , وە وا لە بەندە ئەکات کە زۆر بە چاکی ڕوو لە الله تعالی بکات و بێ ئاگابوون و پشت هەڵکردنی لە طاعەتی الله تعالی لێ دووربخاتەوە و نەیهێڵێت.

*سەعیدی کوڕی جوبەیر ـ رحمه الله تعالی ـ فەرموویەتی : {ئەگەر یادی مردن لە دڵم جیابێتەوە , ئەوە ئەترسم کە دڵم تێکبچێت}.[١]

(١):الزهد ی ئیمام أحمد : ٢٢١٠

جا بەڕاستی بەندە بەردەوام لە خێر دایە مادام هەمیشە سەیرئەکات و بیر لە وەستانی ڕۆژی قیامەتی ئەکاتەوە لە بەرامبەر الله تعالی دا , وە تا بیر لە سەرەنجامی خۆی ئەکاتەوە لەدوای مردنیدا.

*إبراهیمی التیمي ـ رحمە الله تعالی ـ دەفەرموێت : { هێنامە پێش چاوی خۆم کە لەنێو بەهەشتم , وا لە جۆرەها میوە و بەروو بوومی بەهەشت ئەخۆم , وە لەو ڕووبارانەی بەهەشت بە ئارەزووی خۆم ئەخۆمەوە , وە حۆریەکانی لە ئامێز ئەگرم , ئینجا هێنامە پێش چاوی خۆم وا لەنێو ئاگردام , وا لە داری زەقوم ( ژەقنەبوت ) ئەخۆم , وە کێم و زوخاوەکەی ئەخۆمەوە و وا کۆت و زنجیر کراوم لەناو ئەو ئاگرەدا , ئینجا بە نەفسی خۆم وت : ئێی نەفسم , کامەیانت ئەوێت ؟ , وتی : ئەمەوێت بگەڕێمەوە بۆ دونیا تا کارو کردەوەی

چاكە بكەم , ئەڵێت وتم : دەى ئێستا وا لەنێو ئەو ئاوات و ئومێدەت دايت كەوايە هەستە كاربكە بۆ ئەو ڕۆژەت}.

هەروەها پێى بڵێ : ئەى نەفس! ئەگەر مردم كێ هەيە لەدواى مردنم لە شوێنى مندا نوێژبكات و بەڕۆژوو بێت و تەوبەبكات لە تاوانەكانم و كەمتەرخەميەكانم.

---

(١):محاسبة النفس لابن أبي الدنيا : ٢٦

# بنەمای هەشتەم

## {هەڵبژاردنی مەجلیس و دانیشتنەکان و دیاری کردنی هاوڕێیەکان}

الله تعالی دەفەرموێت : ﴿ وَاصْبِرْ نَفْسَكَ مَعَ الَّذِينَ يَدْعُونَ رَبَّهُم بِالْغَدَاةِ وَالْعَشِيِّ يُرِيدُونَ وَجْهَهُۖ وَلَا تَعْدُ عَيْنَاكَ عَنْهُمْ تُرِيدُ زِينَةَ الْحَيَاةِ الدُّنْيَاۖ وَلَا تُطِعْ مَنْ أَغْفَلْنَا قَلْبَهُ عَن ذِكْرِنَا وَاتَّبَعَ هَوَاهُ وَكَانَ أَمْرُهُ فُرُطًا ﴾الكهف: ٢٨

واتە : ﴿ ئارام بگرەو خۆت ڕابگرە لەگەڵ ئەو کەسانەدا کە الله پەرستی دەکەن و یادی پەروەردگاریان ویردی سەر زاریانە لە بەرەبەیان و دەمەو ئێوارانداو , مەبەستیانەو دەیانەوێت کە ئەو زاتە لە خۆیان ڕازی بکەن , ڕوو لەوان وەرمەگێڕەو ( ڕوو مەکە دونیاپەرستان و دەوڵەمەندان ) لەکاتێکدا تۆ زینەت

و ڕازاوەیی ژیانی دونیات بوێت , وە بەگوێی ئەو جۆرە کەسە مەکە کە دڵیمان غافڵ کردووە لە یادی خۆمان ( بەهۆی دونیا پەرستیەوە ) وە شوێنی ئارەزووی خۆی کەوتووە و هەرچی کاروباری هەیە بێ سەرو بنەو لە سنوور دەرچووە ﴾.

عبدالرحمن السعدی لە تەفسیری ئەو ئایەتەدا فەرموویەتی : {ئەم ئایەتە فەرمان کردنی تێدایە لەسەر هەڵبژاردنی هاوڕێی چاک , وە جیهاد کردنی نەفس لەسەر هاوڕێیەتی کردنیان و تێکەڵاوبوون لەگەڵیان , هەرچەندە کەسانی هەژار و نەدار بن , چونکە ئەو سوودانەی کە لە هاوڕێیەتی ئەو جۆرە کەسانەدا هەیە نایەتە ژماردن}. [١]

*وە پێغەمبەر ( صلى الله عليه وسلم ) دەفەرموێت : {الرجلُ على دينِ خليلِه ، فلينظرْ أحدُكم من يُخالِلُ} [٢]

---

(١):تيسير الكريم الرحمن : ٥٤٧

(٢):السنن ی أبو داود : ٤٨٣٣

واتە : {مرۆڤ لەسەر دینی هاوڕێیەكەیەتی , كەواتە با سەرنج بدات و بڕوانێت تا بزانێت هاوڕێیەتی كێ ئەكات}.

*أبو سليمانی الخطابي ـ رحمه الله تعالی ـ لەبارەی ئەم حەدیثە : « مرۆڤ لەسەر دینی هاوڕێیەكەیەتی... » , فەرموویەتی : {مانای ئەم حەدیثە ئەوەیە كە : هاوڕێیەتی ئەو كەسە نەكەیت كە لە دین و ئەمانەتی ڕازی نیت , چونكە ئەگەر هاوڕێیەتی كەسێكی ئاوات كرد ئەوە ئەتبات بۆ سەر دین و ڕێگاكەی خۆی , بۆیە ووریابە دینەكەی هەڵت نەخەڵەتێنێ و سەرەڕۆیی نەكەیت بە نەفسی خۆت و بچیت هاوڕێیەتی كەسێك بكەیت كە دین و ڕێبازەكەی جێگای ڕەزامەندی نییە}.[١]

*بۆیە ئیمامی ابن مسعود ـ رضي الله عنه ـ دەیفەرموو : {خەڵكی هەڵبسەنگێنن بە هاوڕێكانیان , چونكە مرۆڤ تەنها

(١):العزلة:٥٦

هاوڕێیەتی ئەو کەسانە ئەکات کە بەدڵی خۆیەتی و پێی سەرسامە}.(١)

*هەروەها پێغەمبەر ( صلى الله عليه وسلم ) دەفەرموێت : {نموونەی هاوڕێ و مەجلیسی چاک و هاوڕێ و مەجلیسی خراپ وەکو هەڵگری بۆنی میسک و فووکار بە کوورەدا وایە , جا هەڵگری بۆنی میسک یان لەو بۆنەت پێ ئەبەخشێت یان لێی دەکڕیت یانیش بۆنی خۆشی لێ هەڵدەمژیت , بەڵام فووکار بە کوورەدا یان جلەکانت دەسوتێنێت یانیش بۆنی پیسی لێ هەڵدەمژیت}.(٢)

*قاضی عەیاض لە شەرحی ئەم حەدیثەدا فەرموویەتی : {حەدیثەکە بەڵگەیە لەسەر دوورکەوتنەوە لە تێکەڵاویەتی کەسانی خراپ و مەجلیسی تاوان و ئەهلی بیدەع و ئەوانەشی کە غەیبەت و بوهتان بە خەڵک ئەکەن ,

(١):الإبانة الكبرى : ٣٧٦

(٢):متفق عليه

چونكە هەموو ئەمانە شوێنەواریان جێ ئەمێنێت لە دانیشتن لەگەڵیان و هاوڕێیەتی کردنیان , وە حەدیثەکە هاندانی تێدایە دەربارەی دانیشتن و هاوڕێیەتی کردنی کەسانی چاک , وە وەرگرتنی عیلم و ئەدەب و ڕێنمایی باش و ڕەوشتی جوان و بەرز لێیانەوە}.[١]

کەواتە لەسەر بەندە پێویستە کە ئەو هاوڕێیانە هەڵبژێرێت و دەستیان پێوە بگرێت کە یارمەتیدەرینە لەسەر کردەوەی چاکە , چونکە ئەمە لە گەورەترینی ئەو هۆکارانەیە کە ئەبێتە هۆی تەزکیەی نەفس و پاک بوونەوە و چاک بوونی دڵ و دەروونەکان , وە حەزەر بکات و خۆی بپارێزێت لە تێکەڵاویەتی تاوانباران و مەجلیسی فەساد و خراپ , چونکە ئەمە زۆر ترسناکتر و خراپترە بۆی لە گەڕ و گول بوون.

(١):إكمال المعلم بفوائد المسلم : ٨/١٠٨

# بنەمای نۆیەم

## {خۆپاراستن لە عوجبی نەفس و غرور بوونی نەفس}

الله تعالی دەفەرموێت : ﴿ فَلَا تُزَكُّوا أَنفُسَكُمْ ۖ هُوَ أَعْلَمُ بِمَنِ اتَّقَىٰ ﴾النجم: ٣٢

واتە : ﴿ خۆتان بە چاك و پاك مەزانن و خۆتان بە پاڵفتە دامەنێن , چونكە الله خۆی ئەزانێت كە كێ تەقوای هەیە و خۆی ئەپارێزێت لە تاوانەكان ﴾ .

هەروەك لە ئایەتەكەدا بینیمان كە الله عز وجل نەهی كردووە لەوەی كە بەندە مەدح و پیاهەڵدانی خۆی بكات بەوەی كە كەسێكی چاك و پاك و باشە , چونكە لە الله ترسان و تەقوا شوێنەكەی لە دڵ دایە , وە الله تعالیش تەنها خۆی ئەزانێت كە كێ تەقوای هەیە و كێش نیەتی ,

لەبەرئەوەی ئا ئەو مەدح و خۆهەڵکێشانە هۆکارە تاکو ( عوجب و سەرسام بوون بە خۆت ) بچێتە ناو دڵتەوە , وە هۆکارە تاکو بەندە تووشی ڕیاء بێت و بەهۆیەوە کردەوەکانی بەتاڵ بێتەوە.

مرۆڤی ئیماندار هەرچەندە هەوڵ بدات و خۆی ماندووبکات لەسەر ئەنجامدانی کردەوە چاکەکان و دوورکەوتنەوە لە حەڕامکراوەکان ئەوە هەر بەردەوام خۆی پێ موقەصیر و کەمتەرخەمە و خۆی لەپاش هەموو کەسێک ئەبینێت و بەردەوام پێی وایە کە یەکێکە لەوانەی زوڵمی لە نەفسی خۆی کردووە.

*جا سەیربکە ئەگەر ئیمامی أبوبکر ـ رضي اللّٰه عنه ـ کە صدیقی ئەو ئوممەتەیە و باشترینی خەڵکیە لەدوای پێغەمبەر (

صلى الله عليه وسلم ) کاتێک داوای لە پێغەمبەر ( صلى الله عليه وسلم ) کرد کە دوعایەکی فێربکات تاکو لە نوێژەکانیدا داوای پێ لە الله بکات , پێغەمبەریش ( صلى الله عليه وسلم ) فێری کرد کەوا بڵێت : {اللَّهمَّ إنِّي ظَلَمْتُ نَفْسِي ظُلْمًا كثِيرًا ، وَلا يَغْفِر الذُّنوبَ إلاَّ أَنْتَ ، فَاغْفِر لي مغْفِرَةً مِن عِنْدِكَ ، وَارحَمْني ، إنَّكَ أَنْتَ الْغَفور الرَّحِيم}.

واتە : {ئەی پەروەردگارا بەڕاستی ستەمێکی زۆر و گەورەم لە خۆم کردووە و هیچ کەسێکیش لە تاوانەکان خۆش نابێت جگە لە تۆ نەبێت , سا لێم خۆش ببە لێخۆش بوونێک لە لایەن خۆتەوە , وە ڕەحمم پێ بکە , چونکە بەڕاستی تۆ لێخۆشبوو و میهرەبانیت}.

جا ئەگەر ئەو ئەم دوعایەی فێرکرابێت ئەی ئێمە چی و چجای بگات بە کەسانی خوار ئەو...!

*هەروەها دايكمان عائيشه ـ رضي الله عنها ـ كاتێك پرسيارى لەبارەى ئەم ووتەيەى الله تعالى كرد :﴿وَالَّذِينَ يُؤْتُونَ مَا آتَوا وَّقُلُوبُهُمْ وَجِلَةٌ أَنَّهُمْ إِلَىٰ رَبِّهِمْ رَاجِعُونَ ﴾**المؤمنون** ٦٠, واته : ﴿ ئەوانەش كە دەبەخشن لە زەكات و خێر دڵيان دەترسێت ( نەوەكو لێيان وەرنەگيرێت ) , چونكە ئەوانە بێگومانن كە بۆ لاى پەروەردگاريان دەگەڕێنەوە ﴾ , فەرمووى : {ئايا ئەمانە ئەو كەسانەن كە مەشڕوب دەخۆنەوە و دزى ئەكەن ؟ , پێغەمبەريش (صلى الله عليه وسلم ) فەرمووى : نا ئەى كچى صديق , بەڵكو ئەوانە كەسانێكن كە بەڕۆژوو ئەبن و نوێژ ئەكەن و ئەبەخشن بەڵام هەميشە ئەترسن لەوەى كە لێيان قبوڵ نەكرێت}.(١)

---

(١):أخرجه الترمذي في الجامع : ٣١٧٥

*وه عبدالله ى كوڕى أبي مُلكية ـ رحمه الله تعالى ـ دەفەرموێت : « گەیشتووم بە دیداری زیاتر لە سی هاوەڵ , هەر هەموویان ئەترسان لەوەی کە نیفاق و دوو ڕوویی هەبێت تیایاندا}.

*وه ئیمامی حەسەنی بەصری ـ رحمه الله تعالى ـ دەفەرموێت : مرۆڤی ئیماندار هەمیشە چاکەکردن و ترسانی تێدا کۆبووەتەوە , ئینسانی مونافیقیش نێوانی خراپەکاری و نەترسانی تێدا کۆبووەتەوە , پاشان ئەم ئایەتەی خوێندەوە : ﴿ إِنَّ الَّذِينَ هُم مِّنْ خَشْيَةِ رَبِّهِم مُّشْفِقُونَ ﴾**المؤمنون ٥٧** , واتە: ﴿ بەڕاستی ئەوانەی کە ترسی پەروەردگاریان لە دڵدایەو دەترسن لێیان بڕەنجێت ... ﴾ .[١]

(١):تفسير الطبري : ٦٨/١٧

# بنەمای دەیەم و کۆتایی

**{ناسینی نەفس}**

یەکێک لە هەرە بابەتە گرنگەکانی تەزکیەی نەفس کە زانینی زۆر پێویستە لەسەر بەندە , ئەویش بریتییە لە: ناسینی حەقیقەتی نەفسی خۆی , وە صیفەتەکانی بزانێت , بۆ ئەوەی بەندە بە ئاسانی بتوانێت ئاگاداری بێت و چاودێریەکی چاکی نەفسی خۆی بکات , وە بۆ ئەوەی بتوانێت تیماری هەموو ئەو دەرد و ئافاتانە بکات کە بەسەریدا دێت.

الله تعالى لە کتێبەکەیدا بە سێ صیفەتی ناسراو و دیار وەصفی نەفسی کردووە , کە هەر یەکێ لەو صیفەتانەش باس لە حاڵی نەفسەکان ئەکات , ئەوانیش بریتین لە:

## ١- {النفس المطمئنة ـ نەفسێکی هێمن و ئارام}

ئەو جۆرە نەفسە صیفەتی ئەوەیە کە بەردەوام سوکنایی دێت و ئارام ئەبێت بە ئیمان و باوەڕ , وە بە زیکر و عیبادەتی الله تعالی , وە نەفسێکە کەوا بەردەوام بە جوانترینی شێواز ئەچێت بەدەم پەرستش و عیبادەتەکانی الله تعالی , هەروەکو چۆن الله تعالی فەرموویەتی : ﴿ الَّذِينَ آمَنُوا وَتَطْمَئِنُّ قُلُوبُهُم بِذِكْرِ اللَّهِ ۗ أَلَا بِذِكْرِ اللَّهِ تَطْمَئِنُّ الْقُلُوبُ ﴾**الرعد: ٢٨** واتە : ﴿ ئەو کەسانەی کە ئیمانیان هێناوە و هەمیشە بە یادی الله دڵەکانیان ئارام دەگرێت , کەواتە ئاگاداربن کە هەر بە یادی الله دڵەکان ئارام ئەبن ﴾ , وە الله تعالی فەرموویەتی : ﴿ يَا أَيَّتُهَا النَّفْسُ الْمُطْمَئِنَّةُ * ارْجِعِي إِلَىٰ رَبِّكِ رَاضِيَةً مَّرْضِيَّةً * فَادْخُلِي فِي عِبَادِي * وَادْخُلِي جَنَّتِي ﴾**الفجر: ٢٧،٢٨،٢٩،٣٠** واتە : ﴿ لەو ڕۆژەدا بە ئیماندار دەوترێت: ئەی نەفسی هێمن و ئارام * بگەڕێرەوە بۆ لای پەروەردگاری خۆت

بە ڕەزامەندی و لێ ڕازی بوو * سا بچۆرە ناو بەندە چاکەکانی من * وە بچۆرە ناو بەهەشتەکەی منەوە ﴾ .

## ٢- { النفس اللوامة - نەفسی سەرزەنشتکەر}

ئەو جۆرە نەفسەش صیفەتی ئەوەیە کە بەردەوام لۆمە و سەرزەنشتی خاوەنەکەی ئەکات کاتێک هەڵە و تاوانێک ئەنجام ئەدات , یاخود سەرزەنشتی ئەکات کاتێک کەمتەرخەمیەک ڕووی تێ ئەکات لەسەر ئەنجامدانی واجباتەکان , یان کاتێک کەوا طاعەت و عیبادەتەکانی کەم ئەبێتەوە , هەروەکو چۆن الله تعالی فەرموویەتی : ﴿ وَلَآ أُقۡسِمُ بِٱلنَّفۡسِ ٱللَّوَّامَةِ ﴾**القيامة:٢** واتە : ﴿ وە سوێند دەخۆم بە نەفسی لۆمەکەر لەسەر خراپە ﴾.

## ٣- {النفس الأمارة بالسوء ـ نەفسی فەرماندەر بە خراپە}

ئەم جۆرە نەفسەشیان هەمیشە هانی خاوەنەکەی ئەدات بۆ کردەوە حەڕامکراوەکان و ئەنجامدانی گوناح و تاوان , وە ئەیبات بەرەو ئەو شوێنانەی کە مونکەر و تاوان و کردەوەی خراپەی تیا ئەنجام ئەدرێت , وە بەردەوام ئەبێتە پاڵنەری تاوەکو بچێت گوناح و تاوان و خراپە ئەنجام بدات , هەروەکو چۆن لە سورەتی یوسف ـ علیه السلام ـ هاتووە : ﴿ وَمَا أُبَرِّئُ نَفْسِيٓ إِنَّ النَّفْسَ لَأَمَّارَةٌ بِالسُّوءِ إِلَّا مَا رَحِمَ رَبِّي ﴾**یوسف: ٥٣** واتە : ﴿ وە ( یوسف وتی ) من هەرگیز پاکانە بۆ خۆم ناکەم , ( چونکە ) بەڕاستی نەفس زۆر فەرماندەرە بە خراپە , مەگەر ئەو نەفسەی پەروەردگارم ڕەحمی پێ کردبێت ﴾.

ئەمانەی کە باسکران سێ دانە صیفەتی نەفس بوون کە لە ڕاستیدا ئەمانە ئەو حاڵەتانەن کە پەیوەندیان بە نەفسەوە هەیە , جا بۆی هەیە کە ئەم حاڵاتانە بەسەر نەفسدا هەڵبگەڕێنەوە و بگۆڕدرێن , بە گوێرەی ئەوەی کە بەسەر نەفسی ئینساندا دێت , وە لەوەشە کە هەر سێ صیفاتەکە لە یەک ڕۆژدا لە کەسێکدا کۆببێتەوە بە گوێرەی حاڵ و بارو دۆخی نەفسەکە.

وە ئەهلی عیلم چەند نموونەیەکیان بۆ ئا ئەم نەفسە هێناوەتەوە کە حاڵی نەفس لەگەڵ ئینسان ڕوون ئەکەنەوە , بۆ ئەوەی هەست پێ کردنی ئاسان بێت لەسەر ئینسانی موسڵمان و پاشان هەوڵ بدات و خۆی لەگەڵی ماندوو بکات تاوەکو چاک و پاک بێتەوە.

بەڵام لێرەدا تاکو زیاتر درێژ نەبێتەوە تەنها نموونەی دوو زانای بەڕێز ئەهێنینەوە:-

## نموونەی یەکەم:

*ئیمامی ئاجوری - رحمه الله تعالی - هێناویەتیەوە لە کتێبی [ أدب النفوس ] کە فەرموویەتی : { من نموونەیەکت بۆ ئەهێنمەوە لەم بارەیەوە کە بەلاتەوە شتێکی شاراوە نییە إن شاء الله: بزانە کەوا نموونەی نەفس وەکو نموونەی ئەسپێکی جوانی تازە لە دایک بوو وایە , کە هەرکاتێ یەکێک سەیری بکات جوانی و قەشەنگیەکەی سەرسامی ئەکات , جا ئەوانەی کە شارەزاییان بە ئەسپ سواری هەیە ئەڵێن : جوانی ئەم ئەسپە تازە لە دایک بووە هیچ سوودێکی لێ وەرناگیرێت هەتا ئەوکاتەی کە بە چاکی وەرزش و مەشقی پێ ئەکرێت و بە باشی فێری ڕاکردن و پێشبڕکێ ئەکرێت , دوای ئەوە ئینجا نەفع و سوودی ئەبێت بۆ خاوەنەکەی کە ئەبێتە ئەسپێک داواکاری و خواستی لەسەر ئەبێت و ڕاکردنێکی گونجاویشی ئەبێت , وە ئەو

کەسەی کە سواری ئەبێت پیای هەڵئەدات لەسەر ئەو چاک فێرکردن و مەشق پێ کردنەی , خۆ ئەگەر ڕاهێنانی پێ نەکرێت ئەوا هیچ سوودێک لەو جوانی و قەشەنگیەی وەرناگیرێت , وە ئەو کەسەشی کە سواری ئەبێت لەکاتی پێویستیدا ستایش و پیاهەڵدانی ناکات چونکە ئەسپێکی باشی لێ دەرنەچووە , جا ئەگەر لەلایەن کەسانی ئامۆژگاریکار و شارەزا قسەیەک بە خاوەنی ئەسپەکە بوترێت , ئەوە دەزانێت کە ئەو قسەی کردوویانە زۆر ڕاستە و ئەبێتە پاڵنەری تاکو وەکو سوارچاکێک مەشقی پێ بکات , بەڵام تەنها ئەو سوارچاکەش ئەتوانێت مەشق بە ئەسپەکەی بکات کە خۆی زانا بێت بە مەشق پێ کردن پاشان صەبر و خۆڕاگریشی هەبێت لەسەر ئەو عیلمەی کە هەیەتی دەربارەی مەشق پێ کردن , جا ئەگەر ئاشنا بێت بە مەشق پێ کردن و ئامۆژگاریەکانی ئەوە بەڕاستی

خاوەنەکەی ئەتوانێت سوود لەو ئەسپەی ببینێت , بەڵام ئەگەر تەنها سوارچاکێک بێت و هیچ زانستێکی پێ نەبێت لەسەر مەشق پێ کردنی و نەزانێت چۆن ئەسپەکەی فێرئەکات , ئەوە ئەسپێکی خراپی لێ دەرئەچێت و خاوەنەکەشی تەنها ماندوو بوونی بۆ ئەمێنێتەوە و ئەو کەسەشی سواری ئەبێت ستایش و پیاهەڵدانی ئەو ئەنجامە خراپەی ئەسپەکە ناکات , جا ئەگەر سوارچاکەکە زانیاری هەبێت لەسەر مەشق پێ کردن و پەروەردەکردنی ئەسپ بەڵام لەگەڵ ئەو زانیاریەی کە هەیەتی ئارام و خۆڕاگر نەبێت لەسەر نارەحەتی مەشق پێ کردن و خۆی لەگەڵی ماندوو نەکرد , وە تەمبەڵی کرد لەوەی کە پێویست بوو لەسەری بیکات , لە ئامۆژگاری کردن لە مەشق دا , ئەوە ئەسپێکی خراپی لێ دەرئەچێت و باش مامەڵە نابێت لەگەڵ سواریەکان , وە بۆ داواکردن و ڕاکردنیش گونجاو نابێت ,

تەنها مەنزەڕێکی ئەبێت ئەویش بەبێ هەبوونی زانیاری لەسەر پێشبڕکێ , خۆ ئەگەر خاوەنەکەی بیەوێت سوارچاکی پێ بکات , ئەوە پەشیمان ئەبێتەوە لەسەر تەمبەڵیەکەی و لەو ڕۆژەشدا پەشیمانی دادی نادات , کاتێک سەیری ئەسپەکانی تر ئەکات لەکاتی ڕاکردندا , چەند هەوڵ ئەدات ناتوانێت بگات بەوانی تر , وە لەکاتی ڕاکردن سەلامەت ئەبێت , بەڵام گەر بیەوێ پێش ئەوانی تر بکەوێت ناتوانێت و هەوڵی ڕاکردنی زیاتریش بدات سەلامەت نابێت , هەموو ئەمانە بەهۆی تەمبەڵی خاوەنەکەی و ئارام نەگرتنی لەسەر مەشق پێ کردن , ئینجا بە نەفسی خۆیدا ئەچێتەوە و لۆمەی خۆی ئەکات و لەبەرخۆیەوە قسەئەکات و ئەڵێت:

بۆچی تەمبەڵیت کرد و کەمتەرخەمیت کرد؟، بەهۆی ئارام نەگرتنمەوە هەموو ئەو شتانەی کە پێم خۆش نەبوون بەسەرم هات، والله المستعان، جاعەقڵتان بەکاربهێنن-رحمكم الله- لەم

نموونەیە فێربین و تێبگەن , تاوەكو سەرفراز و ڕزگار بن}.[١]

ئەم نموونەیەی یەكەم كە ئیمامی ئاجوری. رحمه الله تعالى. ڕوونی كردەوە بریتی بوو لە حاڵی نەفسی ئینسانەكان , كە وەكو ئەو ئەسپە بچووكە وایە كە پێویستی بە ڕاهێنان و مەشق پێ كردن هەیە , وە پێویستی بە ئارام گرتن و خۆڕاگری هەیە لەكاتی ڕاهێنان پێ كردنیدا , وە سەرەڕای ئەوەش دەبێت عیلمی هەبێت بەو شتانەی كە ئەبێتە هۆی چاك كردن و پاك كردنەوەی نەفسی , بەڵام ئەگەر ئینسان كەمتەرخەم بوو لەوەی كە خۆی فێری ئەو زانیاری و مەشقانە بكات كە دەبێتە هۆی پاك بوونەوەی نەفسی،ئەوە پەشیمان ئەبێتەوە لەكۆتای ڕێگاكەدا بەڵام چ پەشیمان بوونەوەیەك!!

(١):أدب النفوس : ٢٦١

## نموونەی دووەم:

*ئیمامی ابن القیم . رحمه الله تعالی . هێناویەتیەوە و دەفەرموێت : {نەفس چیایەکی گەورە و گرانە لەبەردەم رێبوارانی رێگەی بەرەو الله چووندا , دەبێت بگات بەو چیایە و بەسەریدا سەرکەوێت , بەڵام لای هەندێ کەس سەخت و گرانە و لای هەندێکیش ئاسانە , هەرکەسێکیش الله لای ئاسان بکات بۆی ئاسان دەبێت , چونکە لەو چیایەدا شیو و دۆڵ هەیە , کۆسپ و لەمپەر و درک و داڵ , هەروەها دز و چەتە کە رێگەی کاروانی بەرەو الله چوون ئەگرن , بە تایبەت ئەوانەی بە شەو سەفەر دەکەن , گەر زەخیرەی باوەڕیان لەگەڵ نەبێت و چرای یەقین کە بە زەیتی " تەختبوون " کاردەکات بەدەستەوە نەگرن , ئەوا لەو شیو و دۆڵانەدا دادەخرێن و چەتە و رێگرەکان لە یەکیان دادەبڕن و ناتوانن رۆیشتنەکەیان بەردەوام بێت , زۆربەی ئەوانەی بەرەو

اللە دەچن لەگەڵ گەیشتن بەو چیاو هەورازە گەڕاونەتەوە , چونکە دەستەوسان بوون لە سەرکەوتن بەسەریدا و بڕینی کۆسپ و لەمپەرەکانی , شەیتانیش لەسەر لووتکەی چیاکە وەستاوە و هۆشداری بە خەڵکی ئەدات لە سەرکەوتن بەسەر ئەو چیایەدا و دەیانترسێنێت , بۆیە ئەرک و ماندووبوون و سەختی سەرکەوتن و دانیشتنی ئەو ترسێنەرە لەسەر لوتکەی چیاکە و لاوازی لێبڕان و نیەتی ڕێبواری ڕێگەی اللە یەکدەگرن و ئەمەی لێوە پەیدا دەبێت: دابڕان و گەڕانەوە , وە پارێزراو کەسێکە اللە بیپارێزێت،

هەتا ڕێبواری ڕێگەی اللە زیاتر بەو چیایەدا بەرزبێتەوە هاوار و هۆشداری و ترساندنی ڕێگر زۆرتر و زیاتر دەبێت , کە چیاکەی بڕی و گەیشتە لوتکەکەی: هەموو ئەو ترسانانە ئەبن بە ئاسایش و ئارامی , ئەوکاتە ڕۆیشتن ئاسان دەبێت و بەرهەڵستییەکان و گرانی و سەختی سەر ڕێگە کەم دەبنەوە

, ڕێگەکەی لێ دەبێت بە ڕێگەیەکی بەرینی پڕ لە ئاسایش , ڕێگەکە سەری لە مەنزیلەکانی بەندایەتی و سەرچاوەکانییەوە دەردەکات , مەشخەڵ و ئاماژەی لەسەر دیاری کراوە , شوێنی مانەوە لەسەر ڕێگە هەیە و هەموو ئەمانە بۆ کاروانی ڕەحمان ئامادەکراون , لەنێوان بەندە و بەختەوەری و سەرفرازیدا : هێزێکی مەزن بوونی هەیە , هەروەها ساتێک ئارامی و ئازایەتی دەروون و ڕاوەستانێکی دڵ , فەزڵیش هەر بە دەستی الله یە بە هەرکەسێکی دەبەخشێت کە بیەوێت , الله خاوەنی مەزنترین فەزڵ و چاکەیە}.(١)

لەم نموونەیەشدا حاڵی نەفسی ئێمەی ڕوونکردەوە کە خاوەنەکەی چەندە پێویستی ئەبێت بە پەیمان بەستن و چارەسەر و تیمارکردنی , جا ئەگەر بە ڕێگەیەکی شەرعیانە

(١):مدارج السالكين : ٢/١٠

جیهادی نەفسی خۆی نەکات و سەبریشی نەگرت لەسەر بەربەستەکان ئەوا لە ڕێگاکە دوور ئەکەوێتەوە و دائەبڕێت.

# پێڕست